زنجیرەی پەروەردەیی ٤

# دادوەریی

عوسمان محمد ڕەشید

چاپی دووەم

١٤١٧ک ١٩٩٧ز

بسم الله الرحمن الرحيم

## دادوەری و هەق بێژی:

تەنها ئیسلام و پەروەردەکەیەتی کە بتوانێت وا لەمرۆڤ بکات کە دادوەر و هەق بێژ بێت بەرامبەر بە هەموو کەس و، لەبەر خوا و لەترسی خوا بەسەر دەروونی خۆی‌دا زاڵ بێت و بەرژەوەندی یەکانی بخاتەلاوە ..

خۆ ئەوە شتێکی گرانە لەسەر دڵ و دەروون ، بەتایبەت کاتێك ڕاستی لەکەس و کار یان لەخۆت بڵێیت یاخود بەهۆی هەق وتنەوە خۆت یان کەس وکارت تووشی ناڕەحەتی و زیانێك ببن .

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت :

١) (( يا أيُّها الذينَ آمنوا كُونوا قوامينَ بِالقِسطِ شُهَداءَ للهِ وَلَو عَلى أنفُسِكُم أو الوالِدَينِ وَ الأقربين ، إنْ يَكُن غَنِياً أو فَقيراً فاللهُ أولى بِهِما ، فلا تتبعوا الهوى أن تعدِلوا ، وَ إن تلووا او تُعرِضوا فإنَّ اللهَ كانَ بِما تعملون خبيراً )) النساء/١٣٥. واتە: ئەی کەسانێك‌کە بڕواتان هێناوە هەمیشە بەردەوام و پایەدار بن لەسەر دادپەروەری و شایەت بن بۆخوا لەسەر هەق ، هەرچەند ئەو

شایەتی دانە زیانی خۆتان یان دایك وباوکتان ، یان خزم و خوێشتانی تیابێت ، جا ئەو کەسەی شایەتی یەکەی لەسەر ئەدرێت دەوڵەمەند بێت یان هەژار ، ئێوە لەسەر هەق و ڕاستی لامەدەن بۆ کەسیان ، چونکە پەروەردگار لە پێشترە و نزیکترە بۆ چاودێری ئەوانە لە ئێوە - واتە مەڵێن ئەو کەسە هەژارە با ئێمە لایەنی ئەو بگرین ، چونکە چاری وا هەیە هەقی دەوڵەمەندەکەیە ، وە یان مەڵێن ئەو کەسە دەوڵەمەندە با ئێمە لایەنی ئەو بگرین، چونکە چاری وا هەیە هەقی هەژارەکەیە ، کەواتە هیچ شتێکی دنیایی نابێت کارتان تێ بکات و لە ڕاست بێژی و شایەتی دانی هەق لاتان بدات - وە مەکەونە شوێن هەواوئارەزوو و، لەهەق لامەدەن ، وەئەگەر زمانتان بگۆڕن و هەق نەڵێن ، وەیان لادەن و پشت وەرگێڕن لەهەق ، ئەوە خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن ، وەهەموو کەس پووپەڕووی پاداشتی کردەوەکانی خۆی دەبێتەوە .

●●●

٢) قورتانی پیرۆز لە ئایەتێکی دیکەدا جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکات و دەفەرموێت : ((و لا یجرمنکم

شنآن قوم ان صدوكم عن المسجد الحرام ان تعتدوا ، و تعاونوا على البر و التقوى ولا تعاونوا على الإثم و العدوان ، و اتقوا الله ، إن الله شديد العقاب )) سدہ/۲ ، واتە : با كينەو رق و دوژمنايەتيتان بۆ كۆمەڵێك كە رێی ، مسجد الحرام، يان لێ گرتن ، وڵتان لێ نەكات زيادەڕەوی بكەن لە تۆڵەسەندنەوەدا ، وەيارمەتی يەكتر بدەن لەسەر چاكەوپارێزكاری ، وە يارمەتی يەكتر مەدەن لەسەر گوناەو تاوان و زيادەڕەوی ، لەخوابترسن و پارێزكار بن بەڕاستی خوا سزاكەی سەختە . هەر لەهەمان سورەتدا و لەئايەتی (٨) دا جارێكی‌تر دێتەوە سەر هەمان باس و دەفەرموێت : ((ياايها الذين آمنوا كونوا قوامين لله ، شهداء بالقسط ، و لايجرمنكم شنآن قوم على ان لا تعدلوا ، إعدلوا هو اقرب للتقوى ، و اتقوا الله ، إن الله خبيرٌ بما تعملون )) ، واتە :ئەی كەسانێك كەبڕواتان هێناوە ، راوەستاو بن لەسەر حەق و شايەتيی راستی بدەن ، با دوژمنايەتيتان بۆ گەلێك واتان لێ نەكات كەدادوەر نەبن لەگەڵياندا ، چونكە ئەوە نزيكە لەپارێزكاریيەوە ، لەخوا بترسن و پارێزكار بن ، خوا ئاگادارە بەكارەكانتان .

●●●

٣) قورئانی پیرۆز زیاتر جەخت دەکات و دەفەرموێت ((وَ إذا قُلتُم فَاعدِلوا و لَو كانَ ذا قُربى)) الأنعام/ ١٥٢ واتە: هەق و ڕاستی بڵێن و دادپەروەر بن ، ئەگەر ئەو هەق وتنە لەسەر خزم و کەس وکاریشت بکەوێت - واتە گوێ مەدە نەخزمایەتی .

بەڵێ .. پەروەردەی ئیسلامی توانی ئەو نەفام و نەخوێندەوارانە کە لەهۆز و گەل و عەشرەتیاندا تواوبوونەوە ، بەجۆرێکی ئەوتۆ پەروەردە بکات کە هەمیشە هەق بێژ بن ، لەکاتێکدا کە لەناویاندا باو بوو کە « أُنصُر أَخاكَ ظالِماً أوْمَظلوماً » واتە براکەت سەربخەو هاوکاری بکە ئەگەر ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو . تیرەوهۆزەکەیان هەموو شتێك بوو لایان و کوێرانە دوای دەکەوتن ، هەروەکو یەکێك لەشاعیرەکان دەڵێت :

وَ هَل أنا إلا مِن غَزيةَ إن غَوَت

غَويتُ ، وَ إن تَرشُد غَزيةُ ارشُد

واتە: من یەکێکم لە تیرەی ( غزية ) ئەگەر خوار ڕۆیشت منیش خوار دەڕۆم ، وە ئەگەر ( غزية) بەڕێی ڕاستدا بڕوات منیش ڕاست دەڕۆم .

پێغەمبەر (د.خ) ئەو چەمك و بۆچوونەی گۆڕی و لەڕمووی :« براکەت سەربخە ستەمکار بێت یان

ستەملێکراو » ، موسوڵمانان وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ستەمکار بێت سەری بخەین ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر ستەمکار بوو دەستی بگرن و ڕێی لێ بگرن ، ئەوەش سەرخستنە بۆی .

تەنها ئیسلام توانی مرۆڤ بگەیەنێتە ئەو پلەوپایەیە ، وە هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت وا لەمرۆڤ بکات ، ڕەنگە کەسێك لەکۆمەڵگایەکی نەفامیدا شتێکی وابکات لەبەر هەرمۆیەك بێت ، بەڵام کەهەموو خەڵکی ، یان زۆربەیان بخرێنەسەر ئەو ڕێگایە ، ئەوە هەرگیز نەبووەونابێت ، چونکە «خۆخۆیی» هێزێکە وا لەقوڵایی دەروونی مرۆڤدا ، وەتەنها ئیمان و بڕوایە کەدەتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا ..

پاش فەتحی خەیبەر پێغەمبەر (د.خ) عبداللهی کوڕی ڕەواحەی نارد بۆ لای جوولەکەکان تا بەڕوبوومی ئەهلی خەیبەر بخەمڵێنێت و لەگەڵیاندا بیکات بەدوو بەشەوە بەپێی ئەو پەیمانەی کە بەستبوویان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (د.خ) ، جوولەکەکان ویستیان بەرتیل بدەن بە عبدالله تاوەکو لە خەملاندنەکەدا کەم دابنێت و چاوی لێیان بێت ، ئەویش وتی : بەخوا لای خۆشەویسترین کەسەوە هاتووم ، بەخوا ئێوە لە

مەیمون و بەراز خراپترن و زیاتر رقم لێتانە ، بەلام دڵنیابن ، لەخوداپەرستی یەکەم بۆ ئەو و، ئەوی تریش بوونەکەم بۆ ئێوە ، وام لێناکات دادپەروەر نەبم لەگەڵتاندا .. ئەوانیش وتیان راست دەکەیت ئاسمانەکان و زەوی لەسەر ئەو دادپەروەری یە راوەستاوە !!

بەڵێ ، تووڕنانی پیرۆز بەهۆی پەروەردەی تاقانەی بێ وێنەیەوە ، هەردەم دەتوانێت خەڵکانی دادپەروەر و هەڵبژێر لەراهەم بێنێت .. لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژووی ئیسلام بە هەزارەها رووداوی لەو جۆرەیان تۆمارکردووە و، ئەوەش کە تۆمار نەکراوە لەژمارە نایەت..

جا هەردەم زانایان و خواناسان هەقیان وتووە بە کاربەدەست و دەسەڵاتداران بەبێ ترس و، مەبەستیشیان تەنها رەزامەندی خوابووە ..

رۆژێک پیاوێک بە هارونە رەشید دەڵێت :

- ئەی هارون، ئەگەر بۆ ئەوانەی پێش تۆ بمایە دەست تۆ نەدەکەوت .

- ئەی هارون، ئەوە کۆشک و تەلاری ئەوانەی پێش تۆیەو ئەوەش قەبرەکانیانە ..

- ئەی هارون، مردن بەسە کەئامۆژگاریکار بێت ..

هەروەها بۆ دادپەروەری قازییەکان و هەق وتن و نەترسانیان لەکەس و ، بەکسانی خەڵکی لەبەردەم دادگادا ، نموونەی زۆرمان هەیە ، کە لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامی پێ شکۆدار بووە، دەگێڕنەوە کە ئیمامی عەلی (خ.ر) لە پێڵێ جەنگێکدا زرێپۆشەکەی لێ ون دەبێت و دەکەوێتە لای کابرایەکی جوولەکە کاتێك ئیمامی عەلی دەزانێت کە زرێپۆشەکەی لای ئەو جوولەکەیە بە شکاتی لێدەکات لای قازی ، لەو کاتەشدا ئیمامی عەلی ئەمیری بڕوادارانیش بوو. کاتێك ئیمامی عەلی و جوولەکەکە لەبەردەم قازیدا وەستان و هەریەکە قسەی خۆی کرد، قازی وتی : من دەزانم کە تۆ ڕاست دەکەیت ئەمیری بڕواداران ، بەڵام چونکە بەڵگەت نییەو تەنها حەسەنی کوڕیشت شایەتتە ، ئەوا زرێپۆشەکە بۆ جوولەکەکە دەبێت ، ئیمامی عەلیش ڕازیبوو ئەم ڕووداوە کاری لەدڵی جوولەکەکە کردو، وتی : من شایەتی دەدەم کە ئەمە ڕەوشتی پێغەمبەرانە و، ئەم ئایینەش هەقە و زرێپۆشەکەش هی ئیمامی عەلییە .. وەمن شایەتی دەدەم کە تەنها (الله) خوایە و محمدیش ڕەوانەکراوی خوایە . بەم شێوەیە موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند .. * * *

## ئەم زنجیرەیە :

× پەروەردەیی‌یەو مەبەست تیایدا هۆشیارکردنەوەی ڕۆڵەکانی بێداریی ئیسلامی‌یەو دەستگرتنیانە بەرەو بەختەوەری .

× سەرچاوەکانی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری ئازیزە صلی‌الله علیه وسلم

## ئەڵقەکانی ئەم زنجیرەیە

| | | | |
|---|---|---|---|
| - ڕاسپاردەیی | ٩- سڵەمینەوە | ١٧- گۆڕانکاریی | ٢٥- خۆبەزل زانین |
| - پارێزکاریی | ١٠- دڵسۆزیی | ١٨- دڵنیایی | ٢٦- شەڕەنگێزیی |
| - دامەزراویی | ١١- وەرع | ١٩- ئۆزۆخۆراکی گیانە | ٢٧- برایەتیی |
| - دادپەروەریی | ١٢- چاکەخوازیی | ٢٠- ڕاستگۆیی | ٢٨- ڕەوشت بەرزیی |
| - بەرپرسیاریی | ١٣- بەزەیی | ٢١- گاڵتەپێکردن | ٢٩- ئارامگرتن |
| - ڕەخنەگرتن | ١٤- نهێنی پاراستن | ٢٢- شەرمکردن | ٣٠- ئیرەیی |
| - تەوبەکردن | ١٥- کردەوەی چاک | ٢٣- لەخۆبوردنەوە | |
| - شەونوێژ | ١٦- پابەندبوون | ٢٤- سوپاسگوزاریی | |

## نرخی دوو دینارە